# هەلوێستی ئیسلام

# بەرامبەر بە عەلمانیەت



نوسینی

د. ناصر عبدالكريم العقل

وەرگێرانی

عبدالرحمن امین

# هەلوێستی ئیسلام
# بەرامبەر بە عەلمانیەت

نوسینی
د. ناصر عبدالكريم العقل
وەرگێرانی
عبدالرحمن امین

چاپی یەکەم
١٤١٢ هـ - ١٩٩٢ ز

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادى له، وأشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله .

(يا ايها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون)(يا ايها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالاً كثيراً ونساءً واتقوا الله الذي تساءلون به والارحام إن الله كان عليكم رقيباً)(يا ايها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولاً سديداً يصلح لكم اعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزاً عظيماً).

## پێشکەش

* بە کۆمەڵانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوانەی تێدەکۆشن بۆ بەرزکردنەوەی پەیامی خوا.

* بە موجاهیدە ڕاستگۆیەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوانەی دژ بە دوژمنانی خوا دەجەنگن بۆ بەرزکردنەوەی پەیامی خوا.

* بە زانایانی ئیسلام لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوانەی لە ڕێگای هەق لە تانەو تەشەر ناترسن.

* بە هەر موسلمانێك کە دەیەوێ ڕاستیەتي ڕووڕەشی عەلمانیەتی بۆ دەرکەوێ و نایەوێ بە ڕێچکەو دروشمە گەندەڵ و پوچەڵەکانیان هەڵ خەڵەتی.

* بە هەموو مرۆڤێك کە ڕێگای لێ وون بووەو بە پڕوپاگەندەکانی عەلمانیەت فریوی خواردووەو، دەیەوێ ڕاستی بدۆزێتەوە.

* بۆ هەموو ئەوانە ئەم کورتە باس و لێکۆڵینەوەمان پێشکەش دەکەین، لە پەروەردگارمان دەپاڕێینەوە کە دڵمان بکا بە یەك و لەسەر ڕاستی کۆمان بکاتەوە .«ربنا لاتزغ قلوبنا بعد إذ هديتنا »،« وثبت أقدامنا وانصرنا على القوم الكافرين»

## پێشەکی

بێ ئاگایی یە ـ چۆن بێ ئاگایی یەك - کەوا شوێن کەوتوانی هەق و ڕاستی ئەوانەی پەیوەستن بە بەرنامەی خوا وابزانن هێزی کوفرو ناپاکان فەراموشی کردوون .

بەڕاستی نەزانی وبێ ئاگایی یە ـ چۆن بێ ئاگایی یەك -کە ئیمڕۆ موسلمانان وا بیر بکەنەوە کە دەتوانن خۆ بپارێزن لە بەنگی کوفر ، یان بۆ ماوەیەك دوای خەن !

بێ ئاگایی یە - چۆن بێ ئاگایی یەك - کە کۆمەڵی بڕواداران وا بزانن کە دەتوانن لە گەڵ کوفردا ڕێ بکەون وەیان لەگەڵ چینی عەلمانیەتی دیمکراتی کافر بەرێدا بڕۆن، چاکتر وایە بۆ ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەمڕۆ خۆ ئامادە بکەن بۆ شەڕێکی ناچار (محتوم) بە هۆش و بیرو چەك، لەوەی خۆیان مل کەچی خەیالات و هەند فریودان بکەن «وكذلك نفصّل الآيات ولتستبين سبيل المجرمين» «الانعام: ٥٥»، هەر بەم جۆرە خوای گەورە بە هۆی قورئانەکەی ڕێبازی تاوانباران ڕوون و ئاشکرادەکاتەوە .

هێزی هاندانی هەق و ڕاستی تەنها لە هەستی خاوەن هەقەوە پەیدا نابێت کەوا لەسەر هەقە ، بەڵکو دەبێت لەوەش بێگومان بێت کە بەرامبەر پوچی وناهەق دەجەنگێت، وە بڕوای بە ڕاستی خۆی هەبێت.

بەڵام ئاشکرا کردنی کوفرو پەردە لابردن لەسەر ڕووی خراپەو تاوانباری پێویستە ، بۆ تێگەیشتن و ڕوون بوونەوەی ئیمان و چاکە خوازی ، وە دەرخستنی ڕێگەی تاوانباران مەبەستێکە لە مەبەستەکانی ڕوون کردنەوەی خوای گەورە بۆ بەڵگەو نیشانەکانی چونکە بوونی هەر دوودڵی و گومانێك لە هەلوێستی کافرو تاوانباران و ڕێبازەکانیان وڕوون نەبوونەوەی کارەکانیان کە هەمە جۆرو هەمە چەشنە، ئەبێت بە تەم و مژوو تارمایی یەك لەسەر هەلوێستی موسڵمانان، وەلە ناهەق بە زەحمەت جیا دەکرێتەوە .

ئەم دوو لایەنە دوو لایەنی دژ بەیەکن و دوو ڕێگای لا تەریك و لێك جیاوازن، وە دەبێ هەموو هێڵ ورەنگەکانی دیارو ئاشکرا بێت .

لێرەدا پێویستە ئیمڕۆ هەموو کۆمەڵانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەست بکەن بە دیار کردن و پێناسەکردنی بڕواداران و

دانانی ناو نیشانێکی جیاکەرەوە بۆ بڕواداران، وە ناو نیشانێکی جیاکەرەوە بۆ تاوانباران لە مەیدانی کردەوەدا نەك لە مەیدانی بیردۆزییدا تا وەکو هەڵگرانی بانگەوازی خوایی و بزوتنەوە ئیسلامیەکان بزانن ئەوانەی لە دەوروبەریاندان و لایەنگیریان دەکەن کێن ئایا ئەوانە موسڵمانی ڕاستەقینەو دڵسۆزن یان تاوانبارن ولەسەر ڕێگەی ناڕاستن ؟!!

پاش دیار کردنی ڕێبازی موسڵمانان و بەرنامە و نیشانەکانیان، وە دیاری کردنی ڕێبازی تاوانباران و بەرنامە و نیشانەکانیان بە شێوەیەك کە هەردوو ڕێبازەکە تێکەلاو نەبن و ناو نیشانیان لەیەك نەچێت و موسڵمانان لەگەڵ بێ ئایینی یەکان (عەلمانیەت) و کافرەکان و تاوانباران تێکەڵ بەیەك نەبن .

لە هەر جێگایەکدا ئیسلام لەگەڵ کوفرو بت پەرستی و بێ باوەری(الحاد ) و ئایینە ئاسمانیە دەست کاری کراوەکان ڕووبەڕوو دەبێتەوە .... لە هەر جێگایەك ئیسلام لەگەڵ دوژمنانی مل ملانێ دەکات ، ئەگەر ڕێبازی موسلمانان دیارو بێ پەردەبوو، وە ڕێبازی کافرو تاوانباران دیارو ئاشکرابوو، لەم کاتەدا گومان دروست کردن و شێواندن و گومڕاکردن سوودێکی نابێت .

بەڵام ئەمڕۆ ئەو دەردە کوشندەیەی کە تووشی بزووتنەوە ئیسلامیە ڕاستەقینەکان بووە لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەم بابەتانە نی یە بەڵکو دەردەکە لە بوونی چەند کومەڵ و تاقمە کەسێکەوەیە کە ڕۆڵەی موسڵمانانن و لە خاکێك دا دەژین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان نیشتمانێکی ئیسلامی بووەو بە بەرنامەو شەریعەتی خوا بەڕێوە چووە. پاشان پشتیان لە ئیسلامە ڕاستەقینەکە کردوەو ناوەکەیان هەر بە موسڵمانی بەتی ماوەتەوە و لەعسان کاتدا نارازین و خۆ دوور دەگرن لە بنچینەو بنەرەتی ئیسلام و یاساکانی .

ئەمڕۆ لە جیهاندا جۆرەها میللەت و پارت (حزب) پەیدا بوونە ....وەك عەلمانیەت و جۆرەهای تر لە ڕەنگی جیاجیا بە ڕواڵەت نەوەی موسڵمانن و بەزمانی موسڵمانان قسە دەکەن و هەر کەسێك شوێنیان بکەوێت بەرەو دۆزەخی دەبەن، لەو نیشتمانەشدا دەژین کە خاك و نیشتمانی ئیسلام بووە .

ئەمەش سەخت ترین و دژوارترین دەردە کە ئیمڕۆ کۆمەڵانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەگەڵ ئەم تاقمانەو لەم وڵاتانەدا تووشی هاتوون .

سەخت ترین و دژوارترین دەرد کە ئیمڕۆ بانگەوازی ئیسلامی ڕاستەقینە بە دەستیەوە دەناڵێنی،ئەو دژوارو تاریکی یەیە کە باوەشی داهێناوە بەسەر بنچینەکانی (لا لە الا اللە )ئەمە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە باوەشی داهێناوە بەسەر بنچینەکانی کوفرو شرك و نەفامی ئەو چەرخە.

بەلی ئەو کوسپ و دەردە سەختەی کە ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەگەڵیا ڕووبەڕوو بویتەوە بریتی یە لە شاراوەیی و ڕۆشن نەبوونی ڕێبازی موسڵمانی ڕاستەقینەو چاکە خواز، لەگەڵ ڕێبازی عەلمانیەتی بێ ئایین و موشریك و تاوانبار. تێکەڵاو بوونی دروشم و ناونیشانەکانیان، بە جۆرێك کە هیچ یەك لە ڕێبازەکانی لێك جیا نەکرێنەوە . دوژمنانی ئیسلام شارەزان لەم کەلێنە جا چ ئەوانە بن کەوا داخ لە دڵن وەیان ئەوانەی کە عەلمانیەتیان هەڵ بژاردووە و شەو نخوونی دەکەن بۆ گەورە کردن و تەشەنە کردنی ئەم کەلێنە .

هەوڵدان بۆ جیاکردنەوەی هەق و ناهەق لە یەکتری و ئاشکرا کردنی، بەلایانەوە تاوانێکە پێویستە بە هەموو جۆرێك لە خاوەنەکەی بدرێت. بەتاوانی بە کافرکردنی موسڵمانان لە قەڵەمی

دەدەن !!

بەلایانەوە بڕیاردان و حوکم دان بەسەر مەسەلەی ئیسلام و کوفر دەبێ بە گوێرەی ویست و خواست و ئارەزووی خەڵک بێت وداب (عورف) و نەریتی نێو خەڵکی بڕیاری لەسەر بدات !!

ـ ئەوە خراپترین و کوشندەترین دەردە، وە هەر ئەمەش تەگەرەو کۆسپی یەکەمە، ئەبێ ئەوەکانی هەڵگرانی بانگەوازی خوا بنە بڕی کەن و نەیهێڵن .

پێویستە بانگەواز کردن بۆلای خوا بە ڕوون کردنەوەی ڕێگای خوا نەناسان و تاوانباران دەست پێ بکات ... وە لەسەر هەڵگرانی پەیامی خوا پێویستە لە پێناو دەرخستن و سەر خستنی هەق دا هیچ نەرمی و شلیەك پێشان نەدەن ، هیچ ترس و بیمێك دایان نەگرێت و هیچ لۆمەو تانەو تەشەرێك ساردیان نەکاتەوە و دایان نەمرکێنێتەوە .گوێ نەدەنە گزفەی ئەوانەی دەڵێن (سەیرکەن موسڵمان کافر دەکەن) .

ئیسلام بەم ڕەنگە نی یە کە هەڵفەلەتاوان بۆی دەچن !!

ئیسلام شتێکەو کوفر شتێکی تر .... هەر کەسێك مل کەچی عەلمانیەتی خوانەناس بێت ئەوانەی ئالآی جیاکردنەوەی

ئایین لەژیان و ... جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەتیان هەڵگرتووە بە دەقی حوکمی خواو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کافرن ستەمکارن فاسق و تاوانبارن .

بەڵێ پێویستە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئیمڕۆ بە تایبەتی ئەوانەی خەڵکی بانگ دەکەن بۆ لای خودا ئەم کوسپە ببڕن و لە ناوی بەرن .

پێویستە ئەم مەسەلەیە بە تەواوی لە هەست و دەروونیان روون و ئاشکرا بێت تا وەکو بتوانن ئەو هێزو وزەیەی هەیانە لە پێناوی خوادا بەکاری بهێنن و هیچ گومان و دوو دڵی یەك رایان نەگرێت و هیچ تەم و مژو و گومڕایی یەك پەکیان نەخات . ناتواندرێت تواناو وزەی موسڵمانان لە جێگای خۆیدا بەکار بهێندرێت، تەنها بە دڵنیایی یەکی تەواو نەبێت، کە هەر ئەوانن لەسەر هەق ورەوا .... وە ئەوانەی کە رێگایان پێدەگرن و دەبنە کۆسپ لە رێگای خودا لەسەر کوفرو ناهەقن . بەهەمان شێوە ئەگەر مەسەلەکە بە مەسەلەی کوفرو ئیمان تێ نەگەن هەرگیز ناتوانن باری قورسی ئەم رێگایە بە کۆڵیان دابدەن .... ئیسلامە عەلمانیەکان بێ دین و موشریکن، ئەگەر چی مزگەوتیش دروست

دەکەن و بە بالای ئیسلامەوە هەڵ دەدەن، و لە نێو حیزب و تاقمەکانیاندا لیژنەی تایبەت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئاینی دادەمەزرێنن، بۆ بەنج کردن و سەر لێ شێواندن و گومڕاکردنی خەڵکی سادەو ساکار، ئەمەیە کە پێویستە هۆشمەندەکان بیزانن چ ئیمڕۆ .. چ بەیانی لێی ئاگادار ببنەوە بەوە نەکەن بە دوای ئەوانە بکەون کە خەڵکی فریو دەدەن و یان فریویان خواردووە . بە نیازی بێ هۆش کردنی موسڵمانان لە ئاستی ئەو هێزانەی کە قین لە دڵن بەرامبەر بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ، بەبەردەوامی خەریکی پیلان دانانن بۆیان ، هەر لە پێناوی ئەمەشدا ئەم هێزانە بە تایبەتی عەلمانیەت. هەموو تواناو تەقەللایەکیان خستوتە کارو خەریکی وەشاندنی دوا زەبری کوشندەی خۆیانن کە بیدەن لە ڕەگ و ڕیشەو بناغەی بیروباوەڕی ئیسلام . عەلمانیەتی کافرو ئەو هێزانەی لە پشتیەوەن لە هیچ شتێك ئەوەندە ناترسن بەقەد ئەو ترسەی لێیان نیشتوە لە هۆشیار بوونەوەو بە ئاگا هاتنی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، هەر چەندە ژمارەشیان کەم بێت و کەم تواناش بن ئەتوانن ئاپانەوی ئەم زیندو بوونەوە ببی، سەر سەخت ترین دوژمنانی ئەم ئاینەن ، ئەمانە کافرترین دوژمنانی ئیسلامن

هەر بۆیە بێ هۆشی بە .. بێ ئاگایی بە .. چۆن بێ ئاگایی
بن... کە شوێن کتوتوانی هەق و ڕاستی وابزانن دەتوانن خۆ لە
شەڕو بەڵای کوفر بپارێزن یان بۆ ماوەیەك دوای بخەن ! بێ
ئاگایی بە – چۆن بێ ئاگایی بێت کە هەڵگرانی بانگەوازی خودا
وابزانن بێ ئاینی (العلمانیة) و ئەو هێزە کوفرو ناپاکانەی کە لە
پشتیانەوە هەن وازیان لێ دەهێنن و فەرامۆشیان دەکەن .....
بەڵێ ئەمە جەنگێکە ئەهلی سوننەت و جماعەت ناتوانن خۆی لێ
دەرباز بکەن و لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا نەماوە .... ڕوو بەڕوو
بوونەوەیەکە لایەنگیرانی ناتوانن دژ بەم ناهەقە بێ دەنگ بن .

...... دابەزینە بۆ مەیدانی جەنگ، بزووتنەوە ئیسلامیە
ڕاستەقینەکان ناتوانن خۆی لێ لادەن چونکە عەلمانیە کافرەکان
هەوڵ دەدەن لەناویان بەرن .

کاتی ئەوە هاتووە کۆمەڵانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بە
هەموو تواناییەك خۆساز بکەن و هەموو هێزوو توانایەك بخەنە سەر
یەك و تەم و مژی ئاکۆکی بە لاوەکی یەکان بڕەوێننەوە ، بۆ ئەوەی
دەست بەتال بن بۆ جەنگی ڕاستەقینەو شەڕی چارەنووس، دژ بە
بێ باوەڕو عەلمانیە کافرەکان و ئاغاکانیان .

کاتێ ئێوە هاتووە کۆمەڵانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت شان بدەن بەیەك و ڕیزێکی ڕووبەڕوو بوونەوە دابمەزرێنن دژ بە قین لەدڵو -عەلمانیەکان- دوژمنانی ئەتەوەی ئیسلام .

کاتێ ئێوە هاتووە کۆمەڵانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر دوژمنانیان دیارو یەك لایەکەنەوە بە تەواوی پشت بە پەروەردگاری خۆیان ببەستن چونکە هەر خوا باشترین لایەنگیرو پشتیوانە.

* * *

## پەردە لادان لەسەر هەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە گەڵ عەلمانییەکان [1]

ڕوشتێك هەیە باوەڕ ناكەین كە لە بیری خوێنەری هۆشیارو زیرەك دا نەبێت، ئەگەرچی سەرنگومیش بووە بە هۆی ئەو دوو بەرەكابەتیە هەمیشەیی یەی نێوان ئەهلی سوننەت و جەماعەت و تیرە گومراییەكانی تر كە بە ڕواڵەت موسلمانن.

یەكێك لە گەورەترین مەترسیەكانی كە ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەگەڵیا ڕووبەڕوو دەبێتەوە بریتی یە لە پوچەڵكردن و ڕیسواكردنی دروشمە ڕازاوەو پڕ لە درۆو دەلەسەكانی عەلمانیە كافرەكان، ئەتوانین بە بەردەوامی ژەهر دەڕژێنە نێو مێشك و دڵی ڕۆڵەكانی ئیسلام، وە بۆ ڕیسواكردنی بێ ئایینی (العلمانية)و ڕووبەڕوو بونەوە لەگەڵیا، پێویستە لە پێشەكیا كار بكاتە ئاستی

---

(١) زاراوەی (العلمانية) واتای ڕاستەقینەی ووشەی (Secularism)ی ئینگلیزی و (Secularite) فەرەنسی نا بەخشی. چونكە ووشەكە بە هیچ كلۆجێ پەیوەندی بە واتای (العلم) زانستی نیە. ووشەی (العلم) لە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی بە واتای (Science) دێت، وە بە ڕێبازی زانستی دەوترێ (Scientism). لە ڕاستیدا ووشەی(Secularism) بە ماتای بێ ئاینی (اللادينية) دێت. وەیان بە ماتای دونیایی-

پێویست لە ڕوونی و ئاشکرای و یەك لاکردنەوەی مەسەلەی
ڕووبەڕوو بوونەوەکە بە بێ ئەم یەك لاکردنەوەو ڕوونی و ئاشکرایی
یە، لە توانای ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا نابێ بە ئەرکی
پیرۆستی سەرشانی، خۆی هەڵسی لەم بارو دۆخەدا، زانا لێ
هاتوانی ئیسلام بەرامبەر هێرشی بێ ئایینی یەکان (علمانیة)
یەکیان دەکەوێت و هەڵوێستەکان لارو نارێك و شێواو دەبن و
ڕووبەڕوو بوونەوەکەش دەکەوێتەوە ، وە دوا بەدوای ئەوەش
کۆمەڵانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئامالجة سەرەکیەکان و خاڵە
دیاری کراوەکانیان وون دەکەن بە وون کردنی ئامالجەکانیش خاڵی
دەست پێ کردنی ڕاست و دروستی ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیەش
لەگەڵ کۆمەڵانی جاهیلیەت وون دەبێت چونکە ئەم دوژمنانە بە
کردەوە دژ بە ئیسلام وەستاون و بەئەستۆ پڕو پاگەندە شتی کی ترن.

---

- (الدنیویة) دێت. داتری معارفی بەریتانی دەڵێ مادەی (Secularism) بریتی
یە لە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی، کۆشش دەکات بۆ دوور خستنەوەی مرۆڤ لە ئایین و
ڕووکردنە دونیاو گرنگ دان پێی. بەم مەبەستی ڕاستەقینەی عەلمانیەت بریتی یە لە
دامەزراندنی ژیان لە سەر بناغەی بێ دینی.

## یەکتاپەرستی دژی عەلمانییەتە

ئەگەر بمانەوێ ئەو دووبەرەکایەتییەی نێوان ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە لایەک و عەلمانیەت لە لایەکی تر یەک لابکەینەوە ، وە لەبەر ئەوەی ئەم تەم و مژەی لە مێشکی خەلك دا هاتووە بەسەر بیرو بۆ چوونە ئیسلامیەکان لەم سەردەمەدا ،وە لەبەر ئەو دوو دڵی و گومانە پوچانەی کە ناحەزانی ئیسلام بڵاوی دەکەنەوە لەسەر ئێمە پێویستە دەست بکەین بەلابردنی ئەم تەم و مژو گومانە لەسەر بیرو بۆ چوونە ئیسلامیەکان لە کورتە باسێکدا دەربارەی حەقیقەتی عەلمانیەتی کافر، وەڕوون کردنەوەی حەقیقەتی ئەو یەك خوا پەرستی یەی کە گەورەترین ڕاستی لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا، بەڵکو گەورەترین ڕاستی یە لە بوونەوەردا لەهەمان کاتدا گەورەترین ڕاستی یە دژ بە عەلمانیەت .

ئالێرەوە دەمەوێ زۆر چاك بناسرێ و گرنگی پێ بدرێ لە هەموو قۆناغەکانی بانگڕاهێشتن بو لای خوا . لەگەڵ ڕوون کردنەوەی چۆنیەتی زیندوو کردنەوەی نەتەوەی ئیسلام لەسەر بەیرەوو پرۆگرامی ئەهلی سوننەت و جەماعەت .

ئەگەر واتای (لا اله الا الله) بریتی بێ لە بە کوفردانان و رەت کردنەوەی تاغووت و بڕواهێنان بە خوایەتی خوا ، باشترین پێناسەی تاغووت ئەو پێناسەیە کە(إمام ابن القیم)کردوویەتی ئەگەر بەندە هەرشتێك یان بتێك یان پێشتوایەك یان فەرمان ڕەوایەك لە سنووری خۆی دەربچوێنێ ئەوا پێی دەوترێ تاغووت، جا تاغووتی هەر قەومێك بریتی یە لەو کەسەی کە حوکمی لێ وەر دەگرن لە جیاتی خوداو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، یان دەیپەرستن لە جیاتی خوادا وەیان شوێنی دەکەون دوور لە خواناسی و یان گوێڕایەلی ئەو فەرمانانەی دەکەن کە دەبێت هەر بۆ خوا بکرێت.

دەتوانین بڵێین هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا کە بەدرێژایی مێژوو تەوەرەی ناکۆکی و مل ملانێ ی نێوان پێغەمبەران بووە لەگەڵ گەلەکانیان ـ بریتی یە لە پەرستنی ئەو تاغووتە لەگەل خوا وەیان پەرستنی تەنها ئەو تاغووتە بێجگە لە خوا ئەمەش لە دووکاری بنەیتك بەتەلەوە خۆی دەنوێنێ:

یەکەم: لە ویست و خواست (الارادة والقصد) .

دووەم:لە گوێڕایەلی و شوێن کەوتندا(فی الطاعة والاتباع).

هەرچی هاوبەشی پەیداکردن لە ویست و خواستە ڕوو کردنە بۆلای غەیری خوا بە دروشمێك لە دروشمەکانی پەرستنی خوا وەکو: نوێژکردن یان کڕنوش بردن و قوربانی سەر بڕین و نەزرکردن و دوعاو پاڕانەوە و هاوارکردن بۆ غەیری خواو هێنانەوەی بەڵگەی پوچی جاهیلیەت بۆ ئەم کارانەیان هەر وەکو ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ «ما نعبدهم إلا ليقربونا الى الله زلفى» «الزمر ٣» واتە ئەم بتانە دەپەرستین تا بە هۆی ئەوانەوە لە خوا نزیك ببینەوە. ئەم جۆرە تاغوتی جۆری یەکەم یان بت و سەنەمێکە یان مردوویەکە یان جنۆکەیەو یان شێخیکە یا ...هتد.

بەڵام هەرچی هاوبەش پەیداکردن هەیە لە گوێڕایەڵی و شوێن کەوتندا (في الطاعة والاتباع)، هەڵگەڕانەوەیە لە شەریعەتی خواو ڕازی نەبوونە بە یاساو بەرنامەکەی خوداو ڕازی نەبوونە بە حاکمیەتی خودا لە بوارەکانی ژیان، جا هەمووی بێ یان بەشێکی. ئەمەش سەرەتای دەست پێ کردنی دووڕیانی نێوان ئیسلام و جاهیلیەتە ... دووڕیانی نێوان کوفرو ئیمانە.

ئەمە سیمای هاوبەشی نێوان هەموو جاهلیەتەکانە بە درێژایی مێژوو ، هەر بۆیەش لە جێی خۆیەتی ناوبنرێ بە ئەنقامی

(الجاهلية) هەرچەند لە زانین و شارستانیەتیش دا بەرەو پێشەوە چووبن ... ٦. «افحكم الجاهلية يبغون» ، المائدة:٥٠، (ئایا ئەتوانە داواکاری حوکمێکی جاهیلین)، «أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين مالم يأذن به الله» ، الشورى:٢١،
وە یا هاوبەشی تریان داناوە بۆ خوا کە شەریعەت و بەرنامەیان بۆ دارشتوون کە هەرگیز لە لایەن خواوە رێگای پێ نە دراوە و خوا پێی رازی نی یە ؟.

ئاهەروەکانی ئەم جۆرانەیان یان سەرکردەو حوکمرانێکە رەئیان پیاوێکی بەناو ئایینی یە وەیان دەزگایەکی یاسادانانە، یان رێکخەیەکە یان یارو لەتریەنێکی لێو خەلکی یە یان ئەنجومەنێکی نوێنەرانە یان پەرلەمانێکە وەیا لیژنەیەکە وەیان ئەنجومەنێکی میللی یە وەیا دەستووری یاسای هەنوار هەرەسە یان جۆرەها حیزبە یا .....هتد.

لەراستیدا لە هەردوو شێوەی هاوبەش پەیداکردندا بۆ خوایەتی خوا بۆ یەك سەر چاوە ئەگەرێتەوە ئەویش رازی بوون و وەرگرتنی بەرنامەو یاسایە لە غەیری خوا .

یەکتاپەرستیش (التوحيد) بریتی یە لە رازی بوون تەنها بە

حاکمیەتی خواو ڕوو نەکردنە هیچ لایەکی تر لە پەرستن و قوربانیدا بە هەموو شێوەکانی ... وە ڕازی بوونە بە بەرنامەی خوای گەورە کە بە هۆی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەی کردووە، وە بێجگە لەو کار بە هیچ بەرنامەیەکی تر نەکات ...

«ان الحكم الا لله امر الا تعبدوا إلا اياه ذلك الدين القيم ولكن اكثر الناس لايعلمون» (یوسف: ٤٠)، راتە گێڕانەوەی هەمووکارێك بۆ لای خوا، وە دانانی خودا بە حاکم لە هەموو شتێکدا خۆی لە خۆیدا ئەو پەرستنەیەیە کە خوای گەورە دەیەوێ هەر بۆ ئەو بێ، ئەمەیان ئایینی ڕاست و دروستە کە خوای گەورە بەویان نەبێت بە چی تر ڕازی نیەو وەری ناگرێت ئەگەرچی بە درێژایی مێژوو زۆر بەی خەڵك لێی بێ ئاگان و نایزانن...



## تاغووت وێنەو شێوەی زۆرە

پاش ئەوەی بۆمان ڕوون بۆوە کە هەر ڕوو بە ڕوو بوونەوەیەک لەگەڵ ئەو ڕاستەقینەیەدا بوەیان لەگەڵ بە شێکی دا، ئەوە تاغوتە، جا بە هەر شێوەیەک بێت وەیان لە هەر بەرگ و ڕەنگێکدا بێت، وەیان لە هەر کاتێک دا بێت.

ئادەمی زاد (یەک نەفەر بێت یان کۆمەڵێک) شەهادەی (لا اله الا الله)یان لێ وەرناگیرێ هەتا کوفر بە تاغوت نەکەن و لێی بەرکەنار نەبن.

(إمام ابن تيمية) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ:

مرۆڤ لە سەر دووڕیانێکە ڕێگای سێ یەمی بۆ نیە، یان بەندایەتی خوا دەکات، وەیان بەندایەتی خوای ڕەت داوەتەوەو کەوتوتە بەندایەتی بەندەکان.

هەر بەندایەتیەک بۆ خوای گەورە نەبێت جا ئەم بەندایەتیە گەورە بێت یان بچووک بەندایەتیە بۆ شەیتان (الم اعهد اليكم يابنى آدم الا تعبدوا الشيطان إنه لكم عدو مبين وان اعبدونى هذا صراط مستقيم) (يس: ٦٠-٦١).

ئەمە ئەو عەرەبانە دەگرێتەوە کە خوای گەورە لە بارەیانەوەدەفەرموێت(إن یدعون من دونه إلا إناثاً وإن یدعون إلا شیطاناً مریداً). «النساء: 117» بێ گومان هەندێ لە ڕواڵەتی پەرستن گۆڕاوە ئەو(إناثەی)عەرەبەکان دەیان پەرست نەماوە، بەڵام بەندایەتی بۆ خودی شەیتان نەگۆڕاوە لە جێی (الاناث)ی کۆن بتی تر جێی گرتۆتەوە وەك وڵات و سەر کردەو مەزهەب و حزب و نەتەوەو عەلمانیەت و سەربەستی کە سایەتی و هونەرو سێکس ...هتد. بە دەیان (اناث)ی تازە جێگای ئەو(اناثة)ساکارانەی گرتۆتەوە کە عەرەبەکان دەیان پەرست، دروشمی پڕو پووچیان بۆ داناون و لە جیاتی خوا، دەیان پەرستن و گوێڕایەڵی فرمانەکانیان دەکەن بە پێچەوانەی فەرمانەکانی خوا. بێجگە لە ڕوالەتی پەرستن هیچی تر نە گۆڕاوە جەوهەری کارەکە گۆڕانی بەسەر نەهاتووە ئەویش بەندایەتی شەیتانە. لەسەر ڕۆشنایی ئەم تێگەیشتنە گشتی یە بۆ مانای تاغووت)و(پەرستن) مانا ڕاستەقینەکەی (لا اله الا الله) مان بۆ ڕوون دەبێتەوە...

ئێوەش خۆ دوور خستنەوەیە لە تاغووت و خوا بەیەك ناسینە.

## جاهیلیەت وێنەو شێوەی زۆرە

هەروەك تاغووت هەمە چەشنە لەوێنەو شێوەدا ،نەفامیش هەمە چەشنە لەوێنەو شێوەدا ،دەبێ بزانین نەفامی برێکی پێك هاتووە لە دان پیا نەنان بە بوونی خوا (الحاد) ئەمەش نەفامی بارەڕو بۆ چونە وەك نەفامی کۆمۆنیستەکان (الشیوعیین)، وە برێکیشیان باوەڕیان بە بوونی خوا هەیە بەڵام بە شێوەیەکی نارێك، لە دروشمە پەرستنەکاندا لایان داوە وەك نەفامی هیندی یە وەثەنیەکان و...نەفامی جولەکەو خاچ پەرستەکان...هتد.

برێکی تریان باوەڕی شلە ژاو و شێواویان هەیە بە خوای گەورە، لایانداوە لە ڕێگای خوا پەرستی ڕاستەقینە، وە بە هەڵە دا چوونە لە تێگەیشتنی واتای ڕاستەقینەی(لا اله الا الله وان محمداً رسول الله) هەروەها هاو بەشیان پەیدا کردووە لە بابەتی مل کەچی و گوێ ڕایەڵی بۆ خوا. نمونە ی ئەوانەش ئەو عەلمانیانەن کە خۆیان بە موسلمان دا دەنین، بیر دەکەنەوە، وە وا دەزانن کە تەنها بە ووتنی هەر دوو ووشەی شەهادەتەکە، بوونەتە موسلمان و ڕەوشت ومافەکانی ئیسلامیان داین کردووە.

ئەوانە هەمووی نەفامی و جاهیلیەتە..هەمووی کوفرو لە خوا دوور کەوتنەوەیە.. هەمووی شرك و هاوبەش پەیدا کردنە...

## بەراوورديێك لە نێوان جاهیلیەتی عەرەبی كۆن و جاهیلیەتی عەلمانیەتی نوێ

هەر كەسێك ووردبێتەوە لە بیروباوەڕی جاهیلیەتی عەرەبی كۆن و لێی بكۆڵێتەوە بۆی ڕوون دەبێتەوە كە ئەوان باوەڕیان هەبووە بە بوونی خوای داهێنەر، وە باوەڕیشیان هەبووە بە یەكتایی خوای مەزن لە داهێنان و ڕۆزو(رزق)زیندو كردنەوەو مراندنەوە .. **(ولئن سالتهم من خلق السموات والارض ليقولن الله)** «لقمان:٢٥»، هەروەها باوەڕیشیان بە قەدەر هەبووە **(سيقول الذين اشركوا لو شاء الله ما اشركنا ولا اباءونا ولا حرمنا من شيء)** «الانعام:١٤٨»، هەروەها باوەڕیان هەبووە بە دەسەڵات و خاوەنیەتی خوای بە هێزو توانا لە ڕۆزو گوێ لێ بوون(السمع) وە دیتن (البصر) و زیندو كردنەوە و مراندن و .. **(قل من يرزقكم من السماء والارض امن يملك السمع والابصار ومن يخرج الحي من الميت ويخرج الميت من الحي ومن يدبر الامر فسيقولون الله)** «يونس:٣١»، هەروەها عەرەبەكان لە جاهیلیەتی پێش ئیسلامیشدا هەندێ لە

دروشمەکان(الشعائر)ی پەرستنیان هەبوو وەك بە پیرۆز زانینی (کەعبە)و سووڕانەوە لە دەوریاو(طواف)،وە چوونیان بۆ (عرفات)و بە پیرۆز زانینی مانگەکانی محرم(شهر الحرام) هەروەها کوشتنەوەو سەربڕینی قوربانی و نەزر گرتن بۆ خوا هەروەك لە چیرۆکی نەزرگرتنی عبدالمطلب بۆمان ڕوون دەبێتەوە، وە دیاری بردنیان بۆ (کەعبەی پیرۆز)وە تایبەت کردنی هەندێ لە کێڵگەو ئاژەڵەکانیان بۆ خوا(**وجعلوا لله مما ذرأ من الحرث والانعام نصيبا**) (و الانعام: ١٣٦)، لە بارەی یاسا گەری(تشریع)عەرەبەکان لە جاهیلیەتدا هەندێ ئحدیان دەردەکرد لە گوناهباران وەك دەست بڕینی دز. قورطبی وکلبی(ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) دەڵێن:

قورەیشیەکان لە جاهیلیەت دەستی دزیان دەبڕی ئەوەش سنورێکی ناسراو بووە لە یاساکانی ڕابردووی کۆن . ڕەوشتێکی تر کە عەرەبەکانی جاهیلیەتی کۆن هەیان بووە زۆر باشترو پێش کەوتووتر بوو لە جاهیلیەتی عەلمانیەتی چەرخی ئێستامان دا ئەویش(ئازادی ئایینی)بوو،عەرەبەکان لە جاهیلیەتی کون بڕێکیان لەسەر ئایینی-ابراهیم -پیغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بوون ، وە هەندێکیان لەسەر ئایینی جولەکەو خاچ پەرستەکان بوون ، وە بڕێکیشیا ئەستێرەو جنۆکەو فریشتەیان دەپەرست.

## خوای مەزن چ حوکمێکی داوە بەسەر ئەو کۆمەڵگایە

بەڵام گرنگ ئەوەیە خوای میهرەبان چ حوکمێکی داوە بەسەر ئەوکۆمەڵە؟.

خوای بەرزو میهرەبان بڕیارو حوکمی کوفرو جاهیلیەتی داوە بەسەر ئەو کۆمەڵە .

خوای گەورە هەڕەشەی کردووە لەو کەسانەی کە ئەو شتانەیان کردووە بە بەڵگە بۆ ئیسلامەتیەکەیان- هەڕەشەی کردووە لێ یان کە لە تەرازووی ئیسلام هیچ وەزنێکی یان نیە، وە کوفرە بە خواو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بۆیە جەنگێکی دوورو درێژ بەرپابوو لە نێوان عەرەبە جاهیلیەکان و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ، ئەو شەڕو دوو بەرەکیە تەشەنەی بەست هەتا وای لێ هات کە شمشێر(چەك) بوو بە چارەسەری دوایی. گرنگ ئەوەیە ئەو جەنگە توندو قورسە هۆیەکەی تەنها ووشەی (لا اله الا الله) بوو ، وە پێغەمبەرو(صلى الله عليه وسلم)بە شێوەیەك لەسەری بە رِك بوو ،تۆز قالێك شلی تیا نەدەکردو جاهیلیەتی رەت دەکردەوەو نا پەسندی دەکرد.

لەبەر چی؟!!... چونکە یەکەم جار پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)

داوای شەهادەتی (لا اله الا الله)ی لێ کردن، وەڵامی جاهیلیەکانیش بێ یەك و دوو ئەوەبوو (اجعل الآلهة إلها واحدا إن هذا لشیء عجاب) «ص:٥»، کێشەکە زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو لە بیری جاهیلیەکان، چونکە دەیان زانی پابەند بوون بەم شەهادەیە، واتە ڕەت کردنەوە و بەر کەنار بوون لە هەموو خوایە جۆراو جۆرەکانیان وەك بت و تاغووتی سەرۆکایەتی وتاغووتی تیرەو تاغووتی ئەریت ... هتد

هەروەها دەیانزانی ئەو داوایەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)خۆ بە دەستەوەدان و گوێ ڕایەڵی و ڕووکردنە خوای تاك و تەنهایە ، وە گێڕانەوەی هەموو شتێکە بۆ خوا لە گەورە و بچوك.

* * *

## عەلمانیەت ڕژێمێکی تاغوتی و نەزانی وکوفرە

بە پێی ئەو بۆ چوونە ، زۆر بە ئاسانی دەتوانین حوکمی ئیسلام بەرامبەر بە عەلمانیەت تێ بگەین.

بە کورتی عەلمانیەت ڕژێمێکی تاغوتی و جاهیلی کوفرە پێچەوانەو دژ بە بنج و بنەوانی شەهادەی (لا الە الا اللە )یە.

ئەوەش لە دوو لایەنی سەرەکیەوە.

یەکەم: عەلمانیەت ڕژێمێکە بە پێچەوانەی قورئانی پیرۆز.

دووەم: هاوبەش (شرك) پەیدا کردنە لە پەرستنی خوای میهرەبان .

عەلمانیەت واتە- بە ئاشکرا- ڕژێمێکە دژ بە ڕژێم و دەستوری قورئانی پیرۆزە، کە لە لایەن خواوە ڕەوانە کراوە بۆ مرۆڤ، هەروەها ڕازی بوونە بە ڕژێم و یاسای دروست کراو، وە مل کەچی و گوێ ڕایەلی و ڕێ کردنە لەسەر ڕێبازی تاغوتەکان دژ بە خوای مەزن، ئەوەش وا دەگەیەنی پێویستیەکانی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر بناغەی بێ ئایینی دابمەزرێ، بە مانایەکی تر جیا کردنەوەی ئایینە لە دەوڵەت، یان جیا کردنەوەی ڕامیاری بە لە

نابین - پاشان- بە ئاشکرا ڕژێمێکی جاهیلیە، لە چوار چێوەی ئیسلامەتی دا جێگای بۆ چوونیان و ڕژێم و یاساکانیان ناهێتەوە، چوونکە ڕژێمێکی کافرە بە دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ(**ومن لم يحكم بما انزل الله فاولئك هم الكافرون**) «المائدة:٤٤»

* * *

## حوکم دان لە سەر ڕژێمی عەلمانیەت بە کوفر مووەڵی بۆچی یە!

کەواتە ئەگەر کارەکە بەو شێوە بێت، ئایا لەو بوارە هیچ جێگای گومان و دوو دڵی دەمێنێت بۆ بڕینەوەی ئەو کێشەیە لە دڵ و دەروونی کۆمەڵی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەرامبەر بە عەلمانیەت..؟

لە ڕاستیدا هیچ جێگای دوو دڵی و گومان نیە..! بەڵام دوور کەوتنەوەی ئیسلام لە ڕابەرایەتی کۆمەڵ، لەو ماوە دوورو درێژەی ڕابردوو، وە ئەو تۆزو گەردە چڕەی لە ئەنجامی ئەو بیرو باوەڕە چەوتانە هاتۆتە کایەوە ئەوانە هەردوو لایان هاندەر بوون، بۆ زۆر کەسان کە گومان و دوو دڵی و ڕەشبینی بڵاو کەنەوە، بەڵام ئەوانە شایەنی هیچ نەبوون ئەگەر حالی موسڵمانان ئەوها نەبوا ، کە لە ڕاستی دا بووەتە گەورەترین تەگەرە لە پێش ڕاپەڕین بوون و ڕاپەڕینی (الانطلاق) گەورەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، لەو گومانانەی هەندێ کەس زۆر بە گرانی دەزانن بیدەنە پاڵ ئەو کەس و دەستانەی کە خوای گەورە ناوبانی ناوە بە کافرو نەفامی. بە

بیانوی ئەوەی ئەو دەستەو رژێمانە (بە تایبەتی عەلمانیەتی دیموکراتی) کە بە ئاشکرایی بوونی خوا رەت نا کەنەوە ، وە بە بیانوی ئەوەی ئەو رژێمانە ڕێگای خوا پەرستن ناگرن، بە پێچەوانەوە ئەوەش کە زۆربەی سەر کردەکانیشیان بە زمان شەهادەت دەهێنن و بە رواڵەت نوێژو ڕۆژوو دەگرن، وە جار بە جار حەجیش دەکەن، وە ڕێگەیش ڕێزیان هەیە بۆ زاناهانی ئایینی (بە تایبەتی ئەوانەی لە دەست و پێی خۆیان نزیکن).

لەگەڵ ئەو هەموو گومانە سوك و بێ ماناهانەش کەسانی هەن بە تایبەتی ئەوانەی دروشمی بانگەوازیان بەرز کردۆتەوە، بەداخەوە کە زۆریان لا گرانە و پێ یان ناڕەوایە کە بڵێن ئەو رژێمە عەلمانی و دیموکراتیانە رژێمی جاهیلی و کوفرن، وە ئەوانەی باوەڕیشیان پێ هێناون و لایەنگیریان دەکەن جاهیل و کافرن ئەوانەی ئەو شك و گومانانەش دەخەنە دڵی موسڵمانانەوەو بە خەڵکی را دەگەیەنن ئاشکرایە ئەوانیش واتای راستەقینەی (لا اله الا الله) نازانن لە ناوەڕۆکی ئیسلامەتی تێ نە گەیشتوون، ئەگەر(حسن الظن) مان هەبێت بەرامبەر بە هەندێ کەس و بڵێین ئەوانە لە واتای ئیسلام تێ نە گەیشتوون، بەڵام ئەوە بۆ

ڕۆشنبیران و ئەوانەی ئاگاداری ڕاستەین و خاوەن لێ کۆڵینەوە و تێ ڕوانینن نابێت، وە بە تایبەتی ئەوانەی ئاڵای بانگەوازی ئیسلامیتیان هەڵ گرتووە، بۆیان ناشێ بە ناڕەوایی کارەکە شی بکەنەوە.

لێرەدا ئێمە هیچمان لە دەست نایەت تەنها ئەوە نەبێ، کە بە یادی ئەو کەسانە بهێنینەوە پێ یان بڵێین کە مێژووی دوورو درێژی بانگەوازی ئیسلام و دوو بەرەکایەتی ئەهلی سوننەت و جماعەت لەگەڵ دوژمنانیدا بە درێژای گەردوونەوە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) ڕێگە لەو گومان لێکراوانە دەبڕن.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەنێتە پێشەوە ئایا خۆ گرتنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵەکانی بەرامبەر بەو هەموو گیرو گرفت و ناخۆشی و ئێش و ئازارو تینوویەتی و برسیەتی و جەنگ و جیهاد و دەربەدەری ، بۆ ماوەی بیست و سێ ساڵ لە دوای یەك، وە هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز بە هەموو فەرمان و قەدەغەو داڕشتنی ڕێژێم و دەستور بۆ ماوەی (۲۳)ساڵ ئەوانە هەمووی تەنها بۆ ئەوە بووە کە جاهیلەکان تەنها بە زمان بڵێن(لا اله الا

الله)، وه چەند دروشم(شعائر)ی ئاینی جێ بە جێ بکەن، بە پێی ویستی عەلمانیەکان، وە لاف لەسەر خوا لێ دەن کە ڕێگای خەڵك ناگرن لە جێ بە جێ کردنی ئەو دروشمانە، باشە جیاوازی چی یە لە نێوان ووتەی قورەیشیەکان، کاتێ دەیان گوت ئەی محمد : تۆ ساڵێك خوایەکانی ئێمە بپەرستەو ئێمەش ساڵێك خوایەکەی تۆ دەپەرستین؟ وە لەگەڵ گۆتنەی عەلمانیەکانی ئەمڕۆ کە دەڵێن لە ناو مزگەوتدا خوا دە پەرستین، وە گوێڕایەڵی کەسانی تر دەکەین لە ئەنجوومەنی پەرلەمان و یاساو ڕژێم دانان و لە دادگاو بازرگانی و ئابووری و ڕامیاریدا!!.

* * *

## دەستوری تەتەرەکان و دەستوری مەغۆلییەکان

- ابن کثیر- (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە ڕاڤەو لێکدانەوەی ئایەتی(افحكم الجاهلية يبغون ومن احسن من الله حكما لقوم يوقنون)دا «المائدة: ٥٠»، دەڵێ: دەرچوون و یاخی بوون لە ڕژێم و دەستوری خوای گەورە، کە پڕە لە خێرو خۆشی و بەختەوەری بۆ ئادەمیزاد لە جیهاندا، وە یەکسان کردنی ئەو دەستورە خواییە بە ڕژێم و دەستورە دروست کراوەکانی جاهیلیەتی دەستی مرۆڤ، لای خوا زۆر نا پەسندو ناڕەوایەو دوور کەوتنەوەیە لە ڕێگای ڕاست، وە نەفامی و گومڕاییە .

ئەو ڕژێم و دەستورە دروست کراوانە وەك ڕژێم و دەستورە داهێنراوەکانی جاهیلیەتی پێش ئیسلامن، کە بریتی بوون لە چەند شتێکی هەڵقوڵاو لە ویست و ئارەزووی مرۆڤ.

هەروەها وەك ڕژێمی تەتەرەکان کە حوکمیان بە دەستوری جەنگیزخانی شایەکەیان دەکرد کە پەڕاوی یاسقی بۆ دانابوون.

ئەو پەڕاوەش (یاسق)بریتی بوو لە کۆمەڵێك حوکم و ڕژێم کە لە ئاینی جوولەکەکان و خاچ پەرستەکان و ئەوەکانی ترو ئیسلام،

وەرگیرابوو ، وە زۆربەی حوکمەکانی بە پێ ی ڕیست و ئارەزوو وەرگیرابوو لە ئەنجام دا ئەو پەرتووکە بوو بە شەریعەت و پەیڕەوی تەواوی دەکرا، وە لە حوکمی خواو پێغەمبەر بە ڕەواتر دەزانرا، لێرەدا - ابن کثیر- دەڵێ:

هەر کەسێك ئەو شێوە ڕێبازانە بگرێتە بەر لە چوار چێوەی ئیسلام دەرچووە پێویستە کوشتاری لەگەڵدا بکرێت تا دەگەڕێتەوە ژێر حوکمی خواو چی تر حوکم بە ڕێزی دوور لە ئیسلام ناکات نە کەم نە زۆر.

پاش ئەو ڕوون بوونەوەیە، ئەگەر بە وردی بڕوانینە دەستوری عەلمانیەکان، دەبینین لە پەرتوکێك پێکهاتووە کە پڕە لە ئەحکام و ڕێزم هەمووییان وەرگیراون لە شەریعەتە جۆراو جۆرەکانی ڕۆمانی و فەرەنسی و بەریکیشی لە ئیسلام، وە زۆربەی حوکمەکانی بە پێی ڕیست و ئارەزوو وەرگیراون، ئەو دەستورە واتا دستوری (جەنگیزخانە عەلمانیەکان) بووە بە دەستورو ڕێباز بۆ لایەنگیرانیان و پەیڕەوو گوێ ڕایەڵی تەواوی دەکەن و بە ڕاست و ڕەواتریشی دەزانن لە شەریعەت و ڕێبازی ئاینی ئیسلام.

گەلێ یاسای گشتیان دەر کردووە کە پێچەوانەن لەگەڵ بنچینەکانی ئیسلام، لە بری شەریعەتی قورئان، هەروەها دەسەڵاتی تەواویان ڕەخساندووە بۆی، تا وەکو ببێتە چاوگەی سەرەکی و حوکمڕانی بۆ ڕژێمە دروست کراوەکان، کە زیدە بایی (ربا)و داوێن پیسی و خراپەکاری ڕەوا دەکات و بوەتە ئایین و شەریعەتی عەلمانیەکان.

عەلمانیەکان و لایەنگیرانیان حوکم بە یاسای گەوادی(الدیوثیة) دەکەن کە پیاو بۆی نی یە داوا تۆمار بکات لە دادگا لەسەر ژنەکەی بە تاوانی داوێن پیسی، هەتا ئەگەر هات و ژنەکەی لە کاتی زینا کردندا لەسەر جێگای ژن و مێردایەتی خۆی ببینێ..!! وە ئەگەر لەو کاتەشدا خاوەن ماڵ غیرەتی بزوت و ویستی تۆڵەی خۆی بستێنێ،وە لەوکاتەدا کابرای داوێن پیس دەستی خۆی پێش بخات و خاوەن ماڵ بکوژێ، ئەو کاتە کابرای پیاو کوژ بۆی هەیە لە دادگا لە ژێر سایەی دادو دیموکراتیەت و لێ بوردن خۆی بەر کەنار بکات لەو تاوانە ، بە بیانوی ئەوەی لە کاتی بەرگری کردن لە خۆی خاوەن مالی کوشتووە، لە هەمان کاتدا ژنە داوێن پیسەکەش لە سایەی ئەو ڕژێم ودەستوورانەدا نابێ

پەلجە بۆ ئابڕووی درێژ بکرێت و تاوانبار بکرێت بە داوێن پیسی، لێرەدا کەسێکی تریش نیە جگە لە مێردەکەی داوای لەسەر تۆمار بکات، وە مێردەکەشی کوژراو، کەواتە ئافرەتەکەش بێ تاوان و بەر کەنار دەبێت.

* گومانتان چی یە بەو عەلمانیانەی کە بە ئاشکرا ئایین لە دەوڵەت جیا دەکەنەوە ، وە بەرپێوە بردنی بوونەوەریان دابەش کردووە لە نێوان خۆیان و خوا ، واوەی واتە ئەو پەرستنانەی بریتین لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوا وەك نوێژو رۆژوو .... بۆ خوایان داناوە ، ئەوانی دی کە بریتین لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ لە ئاڵ و گۆڕو ڕامیاری و حوکم و ... بۆ خۆیانیان داناوە؟

* گومانتان چی یە بەو عەلمانیانەی کە دەڵێن هیچ یاسا دانەر(مشرع) نیە تەنها پەرلەمان نەبی، وە هیچ دەسەڵات و هێزو پیرۆزیان بۆ هیچ لایەنێ نیە تەنها بۆ یاسار ڕێنمی دروست کراوی خۆیان نەبێت؟.

* گومانتان چی یە بەوانەی پەست و نارەحەت دەبن هەر وەك ئاغاکانیان لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا پەست و وەڕز دەبن بە بووژانەوەو گەشەکردنی بزوتنەوە ئیسلامیەکان ، وە بە ترسێکی

گەورەی دەزانن لەسەر کورسی و مەسڵەکەیان، ئایا وەکو ئەوەی (ابن کثیر)ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لەسەریان چی بە جێ نایەن؟ کە دەفەرموێ: هەر کەسێ لە شەریعەتی خوا واز بهێنێ و پشت گوێی بخات. ئەو شەریعەتە ڕێک وپێک و تەواوەی لە لایەن خوای گەورە بۆ پێغەمبەری خۆشەویست ڕەوانە کراوە، وە بەدوای شەریعەتێکی تر بکەوێت لەو شەریعەتانەی کە سڕاوەتەوە (نسخ). وەک شەریعەتی جوولەکەکان و خاچ پەرستەکان، لە چوار چێوەی ئیسلام دەردەچێ و کافر دەبێ، باشە ئەگەر ئەوە حوکمی ئیسلام بێت دەربارەی ڕێ کردن لە سەر شەرعی جوولەکەو خاچ پەرستان ئەی دەبێ حوکمی ئیسلام چۆن بێت بۆ ئەو کەسانەی حوکم بە شەرعی (الیاسق)دەکەن.

هەڵبەتە هەر کەسێ ئەو کارە بکات بەرای هەموو موسڵمانان لە سنووری ئیسلام دەردەچی.

لێرەدا ئەو گومانکاریەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە -گومانی شەهادەت هێنانی عەلمانیەکان و نوێژو ڕۆژووەکانیان- کە هیچ بایەخ و سەنگی نیە لە تەرازووی ئیسلام تەنها لای مونافیق و دەغەڵەکان نەبێت.

## دەسەڵاتەکان لەبەر چی بە ڕواڵەت داوای ئیسلام دەکەن؟

لێرەدا پرسیار دەکرێ، ئایا بۆچی ڕژێمە عەلمانییەکان ئایین دەپێسنەوە و بە ڕواڵەت داوای ئیسلامەتی دەکەن؟ لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵات دارن و دەستیان بەسەر هێزو حوکم و کاروباری وڵات داگرتووە!.

وەڵامان بۆ ئەو پرسیارە ئەوەیە: پێشەکی دەمێ ئەوە بزانین جاهیلییەت توانی تا ڕادەیەک یاسای ئیسلام لە کار بخات و دووری بخاتەوە لە دەسەڵات داری حوکم، لەو کاتەدا کوششەکی زۆریان کرد بۆ دوور خستنەوەی موسڵمانان لە ئایینەکەی خۆیان وە بیانخەنە داوی بێ بڕوایی و بەرەڵایی و ماددییەت پاش دۆڕاندنیان لەو پیلانە گڵاوەیان ڕوویان کردە پیلانێکی تر پاش بیر کردنەوەو تێ ڕوانینێکی زۆر بڕیاریاندا یاسایەک داببڕێن دوور لە دەستوورو یاسای قورئانی پیرۆز بێت لە ناوەڕۆکدا بەرە موسڵمانانیش لە خشتە بەن بە ڕواڵەتەکەی ،بەو شێوە و ویژدان و هۆشی موسڵمانانیان مراندو پاشان دەستیان کرد بە ڕووخاندنی

یاسای قورئانی پیرۆز، بۆیە ئەو ڕژێمە عەلمانیە دیموکراتیانە ناوێرن بە ئاشکرا بڵێن ئێمە باوەڕمان بە خوا نیە و نایین بە گاڵتە ئەزانین و دژی ڕێبازی خواین، لە جیاتی ئەوە ئەقیژێنن و هاوار دەکەن و دەڵێن(ئێمە دیموکراتین).

* * *

## ئاڵاو دروشمەکانی عەلمانیەت

دروشم وبیرو بۆ چوونەکەی عەلمانیەکان لە ناوەڕۆکدا جاهیلیەتێکی ڕاستەقینەیە بەڵام زۆر بە دەغەڵی و ژیری یەکی توند کوششیان کرد، خۆیان سەر بە ئایین بکەن، بە خۆ هەڵکێشانێکی نامۆیی(غریب) و بە پیلانی گڵاوی خۆیان دروشمی پێش خستنی شەریعەت و گونجاندنی شەریعەت بۆ بەدی هێنانی پێویستیەکانی زەمانە (تقنین الشریعة) ئەنجامدانی شەریعەتیان بەرز کردەوە بۆ ئەوەی موسڵمانان لەو بیرو بۆ چوونانەی عەلمانیەت ڕا نەکەن. ئەوان دەیانەوێ ڕێبازی عەلمانیەت زۆر بە وردو نەرمی بنێرنە ناو مێشك و بیرو دەروونی موسڵمانان بە شێوەیەك چۆن ژەهر بە نەرمی و بەئاسانی ئەچێتە ناو گیانی ئادەمیزادەو پاشان کاری لێ دەکات و دەی کوژێ ئەوا ئەوانیش بە نەرمی و بە گڵاوی بۆ موسڵمانان دێن و لە ژێر ئاڵای وردە وردە (بەرەبەرە)و بە قۆناغ شەریعەت جێ بە جێ دەکەین.

عەلمانیەتی دیموکراتی هەر وەك ئاشکرایە باوەڕو(العقیدة) شەعائری ئایینی بۆ خوا دادەنێ واتا: ڕێگای نوێژ کردن و ڕۆژو

گرتن و خۆشی و شادی دەربڕین لە هەردوو جەژنی دا (ڕەمەزان و قوربان) ناگرن، وە شەریعەت و ئاڵ و گۆڕ کردن بۆ خۆیان دادەنێن بە پێی ویستی خۆیان ئەوەش لەو ووتەیان دیار دەکەوێ کە دەڵێن (ئایین پەیوەندی بە ڕامیاری نیەو ڕامیاریش پەیوەندی بە ئایین نیە) واتە جیا کردنەوەی ئایینە لە کارو باری میری (دولة)، هەر وەك ئاشکراشە یاسای ئیسلام یاسای دەوڵەت و کۆمەڵە... هتد.

لە ڕاستیدا ئەو جۆرە هەڵس و کەوتانە هاوبەشی تەواوە بۆ خوا، بەڵام لە خەڵك دەیشارنەوەو بە چەند دروشمێکی بە تاڵ خەلك بێ هۆش دەکەن، بە ناوی قوتابخانە بیربەکان(المدرسة العقلانیة) و حوکمی گەڵ بۆ گەلە (حکم الشعب للشّعب) وە ئازادی کەسایەتی (الحریة الشخصیة) کۆمەل لە خشتە دەبەن .

هەموو کردەوەو کاری خراپ و بێ ئابڕویی و بەد ڕەوشتی و زینا کردن لە ژێر چاودێری وپارێز گاری پۆلیس ئەنجام دە درێ (وە لە ژێر دروشمی نەتەوە سەر چاوەی هێزە هەموو هێز،بەلا دادەدەنێن تەنها هێزی لەناو بردن و داپڵۆسینی موسڵمانان نەبێت)و لە ژێر دروشمی ڕەوشەن کردنەوە مرۆڤ لە روناکی

ئیسلام دەردەهێنین و دەهاتخەنە ناو تاریکی و گومڕایی و جاهیلیەت، و لە ژێر دروشمی ئازادی ڕوشنبیری(حریة الثقافة والفکر)هەموو جۆرە خراپەو بێ ئابڕوویی یەك بڵاو دەکەنەوە بە ناوی هونەر(فن)، ڕێگای بێ باوەڕان دەدرێ بۆ هێرش هێنانە سەر ئیسلام هەتا گەیشتە پلەیەك گاڵتە بە ماڵی خوای گەورە(بیت الحرام) دەکەن.

بۆ نمونە لەیەکێ لە شانۆ گەرمەکان لەسەر شانۆ وێنەی خانوی (کعبە)ی پیرۆز دروست کرابوو هەر لە پڕ ئافرەتێکی بێ ئابڕو سەماکەر لە ناویەوە دەر چووە دەرەوەو دەستی کرد بە سەماو گۆرانی ووتن ڕوو بە ڕووی جەماوەر، کە لە بنەڕەتیشدا ئەو ئافرەتە سەر بە ئیسلام بووە!!!

کار بە پلەیەکی وا گەیشتوە کە بۆ ئافرەتە داوێن پیسەکان ڕۆژێکیان تەرخان کردووە بە ناوی (عید الفن) لەو ڕۆژەدا خەلات و پاداشت پێش کەش دەکرێت لە لایەن گەورە پیاوانی دەولەت. هەڵبەتە زانا ئاینی یەکانی سەر بە دەسەلاتیش پیرۆزبایی یان لێ دەکەن و ڕۆژ بە ڕۆژ فتوا لە دوای فتوا دەر دەکەن و ، سەماکردن و گۆرانی و موسیقاو هونەریان بۆ حەلال دەکەن.

## عەلمانیەت دەغەڵ وپووچی یە، تەنها شتی کەم و بێ سوودو بێ بەری لێ دەر دەچێت

خوای گەورە دەفەرموێ (والذی خبث لا یخرج الا نکداً) «الاعراف: ٥٨» لە بەر ئەوەی عەلمانیەت درەختێکی دەغەلە ، بۆیە لە بەرهەمەکەی کەسانێ پەیدا بوونە و دەڵێن موسڵمانین و لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی نێوان بیروباوەڕو ڕەوشت و ئاکار، نا پەسند دەکەن، هەندێ کەس لەوانە شەهادەی بەرزیان هێناوەتەوە لە دانیشتگاکانی خۆمان و دانیشتگاکانی دەرەوە بە نا پەسندی پرسیار دەکەن و دەڵێن ئیسلام چی داوە لە ڕەوشتی کەسایەتی ؟

ئیسلام چی داوە لە ڕووتی ئافرەت و بەرەلایی لە شوێنە گشتیەکان؟ ئیسلام چی داوە لە ئەنجامدانی کاری جنسی بە هەر شێوەیەك؟ ئیسلام چی داوە لە خواردنەوەی عەرەق و مەست بوون بۆ زاخاوی مێشك؟ ئیسلام چی داوە لە زێدە بایی (ربا) ؟ ئیسلام چی داوە لە کاری ئەو کەسانەی خۆیان بە شارستانیەتی دەزانن و بە دوای دروشمی دەغەل دەکەون و دەعەیبن و دەڵێن: ئایین بۆ خوایەو نیشتمانیش بۆ گشت- الدین لله والوطن للجمیع -

هەڵبەتە جێگای سەر سوڕمان نیە چونکە ئەوانە دەرچووی ئەو قوتابخانەیەن کە دەڵێن- واز بێنە لەوەی بۆ قەیسەریە بۆ قەیسەری، وە ئەوەی بۆ خوایە بۆ خوا- چ جیاوازیەك هەیە لە نێوان بۆ چوونی ئەوانەو بۆ چوون و پرسیارەکانی خەڵکی مەدیەن

(اصلاتك تامرك ان نترك مايعبد آباؤنا) «هود،٨٧»

هەروەها پرسیار دەکەن و زۆر بە توندی نزیك بوون وبەشداری کردنی ئاین لە کارو باری ئابووری بە نا پەسند دەزانن، وە نارازین بە پەیوەندی نێوان ئاڵ و گۆڕ کردن وبیرباوەڕ، وەدەڵێن و پرسیار دەکەن ئاین چی داوە لە دزی و فێڵ بازی؟ ئاین چی داوە لە کڕین و فرۆشتن و عەرەق خواردنەوە؟ ئاین چی داوە لە ڕامیاری و کاروباری میری؟ ... نەخێر ... بەڵام ئەوانە خۆیان هەڵدەکێشن و بوختان دەکەن و دەڵێن ئەگەر ڕەوشت و ئاکار لە ئابووری نزیك بێتەوە خراپی دەکات. جێگای سەر سوڕمان نیە چونکە ئەوانە پەروەردە کراون لەسەر بیرو هەستی ئاین جیا کردنەوە لە دەوڵەت (فصل الدین عن الدولة)، (لا دین فی السیاسة) ئیمڕۆ ئێمە لە جاهیلیەتێك داین زۆر لە جاهیلیەتی ئەهلی مەدیەن جاهیلی ترە، جاهیلی ئەمڕۆ بە ناوی زانستی و

زانیاری و شارستانیەتی یە، وە ئەوانەی داوای ڕێبازی یەکتاپەرستی و بیرو باوەڕی پاك و خاوێن دەکەن، وە داوای پابەند بوون بە ڕێبازی ئیسلام و داوێن پاکی لە ئاڵ و گۆڕو پەیوەندی ڕێك و پێك و دڵ سۆزانە دەکەن، لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵ ئەوانە تاوانبار دەکرێن بە کۆنەپەرست و ڕەگەز پەرست و زیادە ڕەوی (تطرف)پیاو کوژو ترسێنەر(ارهاب).

ئایا ئەوە هەمان دەق نیە کە موسڵمانە عەلمانیەکان کارێژی پێ دەکەن؟

* * *

## ڕێبازی عەلمانیەت دەرنەخستنی دوژمنایەتی ڕواڵەت وڕاستەوخۆیە بۆ ئیسلام

لە نەریتی مونافیقەکان و بێ باوەڕانی سەر بەو ئایینە ، دەرنەخستنی دوژمنایەتی ڕاستەو خۆیە بۆ ئیسلام، ئەوان بەو شێوە، وە لە ژێر ئەو پەردەیە، دەتوانن ئاواتە گڵاوەکانی خۆیان بەدی بهێنن و دوستانی خۆیان لە خاچ پەرستان و جوولەکەکان ڕازی بکەن ، کە هەمیشە کۆشش دەکەن بۆ بن بڕ کردنی نەتەوەی ئیسلام.

کۆشش دەکەن بۆ ئەو مەبەستە بە چەکی خۆشاردنەوەو ساختە کردن بۆ گەمارۆدانی موسڵمانان تا جەنگی گەورە بە مەبەستی هێرشێکی کت و پڕی بۆ سەر موسڵمانەکان لە کاتی غەفلەت و بێ ئاگایی. ئەو دوژمنانە زۆر سوورن لەسەر بێ ئاگابوونی موسڵمانەکان تاکو ووشیار نەبنەوە لەوانە بە هەندێ موسلمانی سادەو ساکار دیاری کراو هەبن کە هەست بەو فرۆفێڵە ساختە بازیانە نەکەن جا بۆ ئەو جۆرە موسڵمانانە ئەو هەواڵەی خوارەوە پێش کەش دەکەین!

ڕۆژنامەیەکی جولەکەکان بە ناوی (یدعوت احرتوت) لە ١٨/٣/١٩٧٨م ووتاریکی دەربارەی هێرشەکەی جوولەکەکان بۆ سەر خوارووی لبنان، بڵاو کردەوەو ڕەخنەیەکی زۆر توندوتیژی لە تەلەفزیۆنی ئیسلائیلی گرتبوو دەربارەی ئەو چاو پێ کەوتنە تەلەفزیونی یەی لەگەڵ خاچ پەرستی بەکرێ گیراو سعد حدادی نۆکەر کردبوو، وە لە بابەت دەربڕینی خۆشی و شادی دانیشتوانی دێهاتەکانی مارۆنی خاچ پەرستەکان بە بۆنەی داگیرکردن و سەر کەوتنی جوولەکەکان بەسەر ناوچەی خوارووی لبنان..!

ئەوەی خوارەوە چەند بەشێکە لەو ووتارە و شی کردنەوەیە کە بە ئومێدین سورد بەخش بێت بۆ ئەو کەسانەی هەڵخەڵەتاون بە فرو فێلی عەلمانیەکان.!

ڕۆژنامەکە نوسیبووی :پێویستە لەسەر دەستگای ڕاگەیاندنی ئێمە ڕاستیەك هەیە لە بیری نەکەن کە بە شێکی گرنگە لە ئیستراتیجی ئیسرائیل لە جەنگی خۆی دا لەگەڵ عەرەبەکانا ئەویش ئەوەیە ئێمە سەر کەوتین بە کۆششی خۆمان و دۆستەکانمان لە بەلادانی ئیسلام لە جەنگەکەمانا لەگەڵ عەرەبەکاندا بە درێژایی سێ ساڵی ڕابردوو.

پێویستە ئیسلام بەر کەنار بکەین  لە جەنگ هەتا هەتایی بەکە، بۆیە پێویستە ئێمە هەمیشە ئاگادارببین لە جێ بە جێ کردنی نەخشەو پیلانەکانمان، وە وا نەکەین بە هیچ شێوەیەك موسڵمانەکان هۆشیار ببنەوەو کێشەکە بکەنە کێشەیەکی ئیسلامی و ڕوو بە ڕووی ئێمە ببنەوە، وە ئەگەر هاتوو موسڵمانەکان هۆشیار بوونەوەو هەستیان بزووت ئەو کاتە ئێمە بە هۆی دۆستەکانمان بە توندی ئەو هەست و هوشیار بوونەوە دای دەمرکێنینەوە و ئەو کۆمەڵەی خاوەن ئەو بیرەن لە ناویان دەبەین، بە تایبەتی ئەو ناوچانەی دەورو پشتی ئێمەن، ڕۆژنامەکە لە کۆتاییدا نووسیبووی:

بەڵام تەلەفزیۆنی ئیسرائیلی کەوتە هەڵەیەکی نەفامانە ، هیچی نەمابوو پەیمان لێ بکاتەوە خوری ئەو کارەی تەلەفزیۆنی ئیسرائیل بوو بە هۆی بوژاندنەوەی بیری موسڵمانکان لێرەدا ئێمە زۆر دەترسێین بزوتنەوە ئیسلامیەکان ئەوە بەهەل بزانن بۆ هاندانی موسڵمانەکان دژ بە ئێمە، وە ئەگەر بزووتنەوە ئیسلامیەکان لەوە سەر کەوتن و ئێمەش دوڕاندمان لە داهین کردنی دۆستەکانمان بۆ لێ دانی بزوتنەوە ئیسلامیەکان لەکاتی

گوڵجار دا ئەو کاتە ئیسرائیل لەگەڵ دوژمنێکی ڕاستەقینە (نەك خەیاڵ) ڕوو بە ڕوو دەبێتەوە.

ئەو دوژمنەی هەمیشە ئیسرائیل دەیویست دووره پەرێز بوەستی لەو جەنگەدا.

ئەگەر ئەو موسڵمانانەی کە باوەڕیان وایە جولەکەیەك بکوژن یان جوولەکە بیان کوژێ ئەچنە بەهەشتەوە، سەر بکەون ئەو کاتە ئیسرائیل جێی پێی لەق دەبێ و دەکەوێتە تەنگە تاوی و قەلەقاژێ. لەبەر ئەوەیە ئەو دەغەڵانە لە عەلمانیەکان هەمیشە کۆشش دەکەن ، دروشمی ڕەونەقدار بەرز بکەنەوە بۆ لە خشتە بردنی موسڵمانان و ئارام کردنەوەی دڵ و دەروونیان بە تایبەتی ئەوانەی گومانیان پەیدا کردووە لە ڕێبازی عەلمانیەت.

هەروەها ئەو دەغەلانە کۆشش دەکەن ئیسلام لە ڕیشەوە دەر بێنن بەڵام بەپەرەو لەسەر خۆ تاکو ئەو موسڵمانانەی لە خەوی بێ ئاگایی دانە ووریا نەبنەوە.

* * *

## گرنگی پڕۆگرامەکانی ئایینی لە دەستگاکانی ڕاگەیاندنی عەلمانی

بە درێژایی مێژووی ئیسلام و تا ئێستاش مونافیقەکان و دەغەلەکان لافی ئیمان لێ دەدەن و خۆیان بە موسڵمان و خاوەن مافی ڕاستەقینە دەزانن و هەمیشە خۆیان بە ڕابەری خێرو چاکە دەزانن.

هەروەها هەندێك لە سەر کردەکانی عەلمانیەتی دیموکراتی کافر دەم لە ئیسلام دەکوتن و خۆیان بە خاوەن باوەڕ دەژمێرن ، هەندێکیشیان هەن هەر ڕۆژ لەسەر ڕێگایەك و بیرێکن، ئەمڕۆ کۆمۆنیستەو بەیانی لیبرالیەکی بە دەمارە(متعصب) ئەوەش سەیر نیە چونکە نەتەوەی کوفر هەمووی یەك نەتەوەیە). بەڵام ئەوەی جێی سەر سوڕمانە ئەوەیە ناز ناوی (حاجی و شێخ و...) بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، هەروەها لە ناو پارت و ڕێکخراوەکانیان لێژنەی کاروباری ئایینی دادەنێن!!

ئەگەر هات و ڕژێمە عەلمانیەکانی کافر سوور بن لەسەر تەر خان کردنی پڕۆگرامی تایبەتی بە ناوی پڕۆگرامی ئایینی وەیان

(روحی) له نێوان دەزگاکانی ڕاگەیاندنی شەبتانی خۆیان.

له کاتێکدا دستوورو ڕژێمی جاهیلیەت دادەنێن و حوکمی پێ دەکەن له نێوانیاندا هەندێ له حوکمی ئەحوالی کەسایەتی له ئیسلام وەردەگرن. هەر ئەوانن له ڕۆژ نامەکانی خۆیان لاپەڕەیەك تەرخان دەکەن و ناوی لێ دەنێن لا پەڕەی بیری ئاینی!!

هەر ئەوانن دەڵێن جێگای ئاین تەنها مزگەوتە، وە بۆ هەڵخەڵەتاندنی موسڵمانان جارێك له ژیانیان دا دەچن بۆ حەج، وە یان عومرە و هەموو دەستگای ڕاگەیاندنی خۆیان پڕ دەکەن له بڵاو کراوەو وێنەو .... هتد، وە ناوە ناوە دەچنە زیارەتی خانوی شەیتانی له خۆرهەلات و خۆرئاوا بۆ وەرگرتنی پرۆگرام و پیلان و فەرمان و ...هتد.

* * *

## عەلمانیەکان زانایەکانی یان دەبەزێنن

ئێمە پرسیارێك ئاراستەی عەلمانیەکان و ئەو کەسانەی پێ یان هەڵخەڵەتاون دەکەین و .. دەڵێین ئەگەر هاتوو بەشێکی کەم لە پێویستی یەکانی ژیانی ئادەمیزاد - مەبەست دەستوری ژیانە - لە چوار چێوەی ئیسلام دەرمان هێنا کە خوا بۆی داناوەو نەخشەی بۆ کێشاوە بۆ پێویستیەکانی ژیانی مرۆڤ لەو دونیایەدا ... لە کوێ یاساو پرۆ گرام و دەستوری ئەو بەشەیە وەر دەگرین ؟ بۆ ئەو بەشەو ئەو کەلێنەی پێ پردەکەینەوە .وەلامەکەی هەر چۆن بێت ئەنجامەکەی یەکەو گومانی تیا نیە.

* ئەنجامەکەی .. هاوبەش پەیداکردنە بۆ خوا..... ئایا هاوبەش(شرك) پەیدا کردن لەوە ڕوون و ئاشکراتر دەبێت؟ مەبەست هاوبەشی گوێڕایەڵی و شوێن کەوتنە (شرك الطاعة والاتباع) ئەو جۆرە کارانە هاوبەشیە لە پەرستنی خوا، هەر چەندە ئەوانەی ئەو کارە دەکەن بێ ئاگاش بن لە واتای ڕاستەقینەی پەرستنی خوا بە تەنهایی . ئەوەش نامۆ (غریب)نیە لەسەر جاهیلەکان. ئەوەتا ـ عدی بن حاتم ـ لە کاتی ژیانی جاهیلیدا

نەیدەزانی ئەو کارانە هاوبەشن (شرك) بۆ خوا بەڵام کاتی گوێی لە پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم) دەی فەرموو خوا دەفەرموێ :

**(اتخذوا احبارهم ورهبانهم ارباباً من دون الله)**

«التوبة:٣١» . عدی گوتی (پێش ئیسلام بوونی خاج پەرست بوو) ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە زانا ئایینیەکانمان نەدەپەرست، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی :- ئەی حەلالیان قەدەغە نەدەکرد لێتان،وە حەرامیشیان بۆتان ڕەوا نەدەکرد ؟ .. ئێوەش گوێڕایەڵیتان دەکردن؟ عدی: گووتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. پاشان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەوە پەرستنە).

(ابن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) :- بەو بوونەوە دەڵێ: (ئەوانە واتە بەو کارانەیان هاو بەشیان بۆ خواو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پەیدا کردووە هەر چەندە نوێژ کردن و کڕنوش بردنیشیان بۆ زاناکانیان نەبووە).

عەلمانیەتێك کە لە بارەی جاهلیەت هاتۆتە کایەوە لە ژێر دەستیان پەروەردە بووە، کوفرێکی ڕوون و ئاشکرایەو هیچ گومانی تێدانیە . بەڵام شاردنەوەی ئەو شیرکەو پەردە بەسەر دادانی و گومان پەیدا کردن لێی. لە لایەن پێشەواو بانگەوازانی

عملانیەتەوەیە. چونکە زۆر چاك دەزانن درێژە دان بە جاهیلیەتەکەیان و ژیان ودەسەلاتیان لە ناو وولاتانی ئیسلامی بەو گومان و شاردنەوەیە بەندە ، وە مان و نەمانیان بەستراوەتەوە بە گومان خستنە ناو بیرو مێشکی موسلمانان و گومراکردنیان لە رێگای بەرز کردنەوەی دروشمە بریقەدارەکانیان کە بەنەرەتی ئامانجە گلاوەکانیان دەشارێتەوە. پاش ئەوەی عەلمانیەتی خوانەناس نیشتمانی ئیسلامیمانی داگیر کرد، دوژمنانی ئیسلام هەموو هەول و تەقەللا و ئامرازەکانی خۆیان بەکار هێنا بۆ کز کردنی بیرو باوەڕی موسلمانان و لەبەر چاو خستنی ئەحکامەکان و یاسای ئاینەکەیان و ئاوەژوو کردنەوەی مێژوویان و تێك و پێکدانی یەکێتی یان ، ئەوە بوو بە هۆی سەر لێ شێواندن و پەردە کێشان بەسەر ڕاستیەکان و پێچەوانە کردنەوەیان .

هەموو جۆرە شێوەکانی گومڕایی و دروو دەلەسەو بەد بینی یان هێنایە کایەوە، ئەویش لە ڕێگای بلاو کردنەوەی نوسینەکانی بەکری گیراوە خاچ پەرستەکان و پڕو پاگەندەی خۆ فروشان کە دەربڕی بیری جاهیلی نوێن.

## موا ووته

له کۆتاییدا دەڵێین ئارۆزی و تەم و مژی ئەو گیرو گرفته بووەته هۆی کۆ بوونەوەی چەند کەسانێك له دەورو بەری پارته عەلمانیەکان به مەبەستی دابین کردنی پارووە نانێك، وەیان خۆشی یەکی دونیایی، وەیان به هەر مەبەستێکی تر، که پێیان هەڵخەڵەتاون.

ئەگەر بهاتبایه ئیسلام بەڕاستی له دڵ و دەروونیاندا بچەسپابایه، به هیچ کلۆجێ له دەورو بەریان کۆنەدەبوونەوە و یەك کەسیشیان پێ له خشته لا نەدەبرا.

مرۆڤی خاوەن باوەڕی به تین و ڕاستەقینه، که شەوو ڕۆژ ئەو ئایەته دەخوێنێتەوە (لا تجد قوماً يؤمنون بالله واليوم الآخر يوادون من حاد الله ورسوله ولو كانوا آباءهم او أبناءهم او إخوانهم او عشيرتهم) «المجادلة:٢٢» چۆن ڕازی دەبێت به لایەنگیری ئەو عەلمانیه کافرانه.

دەبێ چ دوژمنکاریەك لەوە گەورەتر بێت که عەلمانیەکان به ئاشکرا داوای ڕەت کردنەوەو بەر کەنار کردنی شەرعی خوا دەکەن،

بەبێ شەرمانە هەوڵ دەدەن ئایین لە ڕێکخستنی کاروباری ژیانی مرۆڤ ڕامالْن و دووری بخەنەوە، بە بیانوی جیا کردنەوەی ئایین لە دەوڵەت(فصل الدین عن الدولة) دەبێ چ سەر پێچیەکی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەورەتر بێت لە بەربەرەکانی خوای گەورە لە مافی یاسا دانان.

* ئایا کاتی ئەوە نەهاتوو موسڵمانان ڕیزەکانی خۆیان ڕێك بخەن و چەك و تفاق کۆ بکەنەوە بۆ ترۆکاندنی دوژمنانیان؟

* ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە موسڵمانان واز بهێنن لە دووبەرەکایەتی و دەمە تەقێی نێوان خۆیان.

* با هەموو لایەك بزانین پەردە لادان لەسەر ڕووی تۆ کەرایەتی و خیانەتکاری ڕێکخراوە عەلمانیەکان وفرو فێل و پیلانەکانیان لەسەر نەتەوەی ئیسلام هەنگاوێکە بۆ ڕێگای ڕاست و دروست.

* ڕیسوا کردنی بێ باوەڕان و مونافیقان لەوانەی دوژمنانی ئیسلام ناویان ناون بە سەرۆك و پێشەواو بلیمەتی ڕامیاری و وێژەو هونەرو... هەنگاوێکە بۆ ڕێگای ڕاست و دروست.

* ڕوون کردنەوەو ڕاگەیاندن، بە هەموو لایەك، کە حوکم

کردن بە شەریعەتی ئیسلام بەستراوەتەوە بە بنچینەی ئیسلام ، وە حوکم کردن بە رژێمە دروست کراوەکان، پاشگەزو هەڵگەڕانەوەی ئاشکرایە لە ئیسلام.

* بووژاندنەوەی بیری جیهادی و فەرمان کردن بە چاکەو قەدەغە کردنی خراپە کاری ... هەنگاوێکە بەرەو ڕاستی.

* فێر بوون و فێر کردنی زانستی شەریعەت و کار کردن پێی هەنگاوێکە بەرەو ڕێگای ڕاست.

* ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دڵمان نەرم بێت و بەرخسێ بۆ هەق؟

(الم يأن للذين آمنوا ان تخشع قلوبهم لذكر الله وما نزل من الحق ) « الحديد:١٦»

لە کۆتاییدا لە خوا داوا کارین ڕێ نموونی و ڕێ بەریمان بکات بۆ ڕێگای ڕاستی ئیسلام .

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

پیشاوەر/ پاکستان

١٩٩٢/٣/٢٥

# ناوەڕۆك